ناوی نامیلکە: یوسفێ زارۆک
هۆنراوەی: ڕێکارێ مزویری
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر
نیگار : مریەم عبداللە
ساڵی چاپ : ١٤٢٦ - ٢٠٠٥
نۆرەی چاپ : یەکەم
تیراژ : ٢٠٠٠ دانە
ژمارەی سپاردن : ٣٦ ساڵی ٢٠٠٤

# یوسفێ زارۆك

هێش بچویك بۆی تۆ منـــال
ب فێـــل تــۆ بــری ژمـال
تـــۆ ئێخستی ناڤـا چـال
کـاروانییا تــــۆ بــری

وان زۆردارا وان بـــــرا
ب درۆ و هـێســــترا
تو کـریه خـوارنا گـــورا
بۆ داڤێن ته ڕست هری

## یوسفی منداڵ

چونکه براکانی یوسف ڕقیان له یوسفی منداڵ دەبووه بەفێڵ لەماڵەوه بردیانه دەرەوەو لەناو بیرێکی ئاویان دانا، کاروانیەکانیش یوسفیان بۆ خۆیان برد . برا زۆردارەکان که گەڕانەوه بۆ ماڵ به درۆ گوتیان: ((گورگ یوسفی خواردوه))

گـــۆت بابـێ تەیـێ هـەژار
ئەم مژویل بووین لسەر کـار
گـورا یــوسف بــرو خــوار
بــراییّـــن درِك و ســــتری

گەل چـەند پەیڤـێن درەوین
هــەردوو چاڤـــان دگـــرین
نـــادەر کـراسـێ بخـــوین
یـێ بـخوینـێ سـۆرکری

درۆیان لەگەڵ باوکی خۆیان کردو پێیان گۆت: ((ئێمە خەریکی کارکردن بووین، گورگەکان یوسفیان خوارد)).
ئەم برایە دڵ ڕەقانە لەگەڵ قسەکردنیاندا بەدرۆ دەگریان و کراسی یوسفیش، کەبەخوێنیان سوور کردبوو نیشانی باوکیان دەدا بۆ ئەوەی باوەڕ بە قسەکانیان بکات.

ب فیـــلا وەکـــی ڕویـڤی
وان خـویـــنا پەزێ کویـڤی
کـــربوو یـــا مـــــــرۆڤـــی
ب درەو گـۆت یێ مـری

بـابـێ تـەیێ پـیر و کـال
ژبـەرتـە مـاڤە عـەبـــدال
ڕێـــتن ڕۆنـــدکیـــت زەلال
دل و جـەرگ لـێ بهری

ئەو خوێنەی کە کراسی یوسفیان پێ سوورکردبوو خوێنی گیانلەبەرە کێوییەکان بوو.
باوکی یوسفی مندالْ زۆر دلْتەنگ و نیگەران بوو ، لەهەردوو چاوەکانی فرمێسك بەگووڕ دەهاتنە خوارەوەو دەگریا .

بوی سەربارێ کاروانی
ل مسرێ بێ خودانی
فروتی ب ئەرزانی
کیە بوتە نەگری ؟

بێکەس ل غەریبیێ
ل تە دکەن زوریێ
بۆ کارێ پیساتیێ
لێ پاك و خۆڕاگری

کاروانەکانیش یوسفی منداڵیان لەسەر باری کاروانەکەیان داناو لەگەڵ خۆیان بەرەو وڵاتی میسر بردیان .
لەم وڵاتەدا بەچەند زێڕێکیان فرۆشت، لەپاش گەورەبوونی جارێکی تر زۆریان لە یوسف کرد بۆ ئەوی کاری نابەجێ و دوور لە ڕەوشتی بەرزی مرۆڤ ئەنجام بدات . بەڵام ئەو هەر بەخۆڕاگری مایەوە .

تــو هــەیــڤا چواردە شەڤی
ژ خـــاتــوینــیْ دڕەڤــی
دابناڤ پیـسیێ نـەکەڤـی
ڕەش نـابـی تـو بەفـری

خورتــەکــێ قــەهرەمــانی
بـــۆ خــاتــرا یـــەزدانــی
تە خــۆ پاراست ب جوانی
تــە کارێ پیس نــەکـری

چونکە یوسف لاوێکی زۆر جوان بوو
خاتوونی میری میسر لەناو ژوورێکدا
قایمی کردو ویستی کاری بەدڕەوشتی
لەگەڵدا ئەنجام بدات بەلام یوسف
لەترسی خوای گەورە . خۆی لەم
خاتوونە دوور خستەوە و ئەم کارە
نابەجێیەی نەکرد.

چالێ هاتی زیندانێ
سەرخاترا ئیمانێ
تەمل دا بەرخۆدانێ
هەرگاڤ دکەی زکری

ل خەونا ددەی ڕاڤا
توی بینایا دووچاڤا
رویێن تە ددەن تاڤا
هەرێ ساخی و نەمری

چونکە یوسف لەگەل خاتوونی میسر ئەم کارەی ئەنجام نەدا، یوسفیان بەندکرد. هەر لەناو بیرەکەوە تاوەکو ناو بەندیخانە، یوسف مرۆڤێکی خۆڕاگر و بەتوانابوو . خوای گەورە و میهرەبانیش یوسفی زۆر بەجوانی دروست کردبوو و شارەزایەکی تەواوی پێدابوو لە بواری شرۆڤەکردنی خەونەکان .

بئـــارامـــی و هـــــەداریێ
تـــوبـــویـــە بـــەرپـــرســـیاریێ
گـــەنـــج و ســـامانیێ کـــاریێ
هـــێژایـــەك پـــڕ شـــاكـــری

لەکۆتایدا ڕۆنبووە کە یوسف مرۆڤێکی بێ گوناهە و ڕاستگۆیە، لە بەندیخانە هاتە دەرەوەو، بەم بەهرە و خۆڕاگری و سەبرو ئارامیەوە بووە بەرپرسیاری هەموو گەنجینەو سامانی وڵاتی میسر . لەسەر هەموو نەخۆشیەکانیش هەر سوپاسی خوای گەورەی دەکرد .

له بڵاوكراوەكانی نووسینگەی تەفسیر بۆ منداڵان:

- شێردا بۆ دا پیردا.
- دار سێو و مانگا.
- ڕۆڵەكانم.
- كورتە چیرۆك بۆ منداڵان.
- منداڵی مسوڵمان چی دەڵێ؟
- مانگا سپاردراوەكە.
- پەپووی سولەیمان.
- سولەیمان و مێرووولە.
- هەنگ و هەنگوین.
- سەگی پیاوانی ئەشكەوت.

